# عبدالله بن المبارك (١١٨ - ١٨١ هـ) رحمه الله تعالى



١ - **أحمد بن حنبل** (٢٤١ هـ) ئەڵێت : (هیچ کەسێک لە سەردەمی إبن المبارک دا هێندەی ئەو بەدوای زانست ەوە نەبوو، چوو بۆ یەمەن و مصر و شام و بەصرە و کوفە، لە گێڕەرەوانی زانست بوو وە ئەهلی ئەوە بوو، لە بچووک و گەورەکانی نووسیەوە، وە شتێکی گەورەی کۆکردەوە، وە فەرموودەوانێکی حافظ بوو) .

٢ - **يحيي بن آدم** (٢٠٠ هـ) ئەڵێت : (ئەگەر بەدوای بابەتە وردەکاندا بگەڕامایە و لە کتێبەکانی إبن المبارک دا نەمدۆزیایەتەوە ئەوە بێئومێد ئەبووم) .

٣ - **يحيي بن معين** (٢٣٣ هـ) ئەڵێت : (إبن المبارك کەسێکی زیرەکی جێ متمانەی جێگیر بوو، وە زانا بوو فەرموودەکانی سەحیح بوون) .

٤ - **أسود بن سالم** ئەڵێت : (إبن المبارك پێشەوایەک بوو خەڵکی شوێنی ئەکەوتن، لە جێگیرترین کەسەکان بوو لە سوننەتدا، ئەگەر کەسێکت بینی تانە لە إبن المبارك ئەدات تاوانباری بکە لەسەر ئیسلامەتیەکەی) .

٥ - **نعيم بن حماد** (٢٢٨ هـ) ئەڵێت : (هیچ کەسێکم نەبینیوە عاقڵتر بێت لە إبن المبارك، وە عیبادەت زیاتر بکات لەو) .

٦ - **علي بن الحسن بن شقيق** (٢٢٥ هـ) ئەڵێت : (لە شەوێکی ساردا هەستام لەگەڵ إبن المبارك بچم بۆ مزگەوت، کە گەیشتینە لای دەرگاکە باسی فەرموودەیەکی بۆ کردم، یان من باسی فەرموودەیەکم بۆ کرد، بەو شێوەیە باسی فەرموودەمان کرد هەتا بانگبێژ هات بانگی نوێژی بەیانی بدات) .

٧ - **حبان بن موسى** (١٩٩ هـ) ئەڵێت : (ڕەخنە کە إبن المبارك گیرا لەبەر ئەوەی پارە ئەبەخشێت لە جگە لەو شوێنەی خۆی لێی دائەنیشێت، ئەویش وتی : من لە شوێنێک کۆمەڵێک ئەزانم کە خاوەنی فەزڵ و ڕاستگۆیین، هەوڵیاندا بۆ فێربوونی فەرموودە، جا لەبەر ئەوەی خەڵکی

پێویستیان پێیان بوو بەباشی هەوڵی فێربوونی فەرموودەیان دا، جا ئێستا موحتاجن، ئەگەر وازیان لێ بهێنین زانستەکەیان لەناوئەچێت، وە ئەگەر یارمەتیان بدەین ئەوە زانست بڵاو ئەکەنەوە بۆ ئوممەتی محمد ﷺ، وە نازانم لەدوای پێغەمبەرێتیەوە هیچ شتێک باشتر بێت لە بڵاوکردنەوەی زانست) .

٨ - هەندێک لە هاوەڵانی إبن المبارک وەکو **الفضل بن موسى** و **مخلد بن الحسين** کۆبوونەوە و وتیان : (وەرن با ئەو تایبەتمەندیە باشانە بژمێرین کە لە إبن المبارک دا هەن، جا وتیان ئەمانەی لەخۆیدا کۆکردووەتەوە : زانست، فیقه، ئەدەب، نەحو، زمان، زوهد، ڕەوانبێژی، شیعر، شەونوێژ و عیبادەت و حەج و جیهاد و ئازایەتی و جەنگاوەری و هێز، وە وازهێنان لەو شتەی پەیوەندی بەووە نییە و ویژدان) .

٩ - **سفيان بن عيينة** (١٩٨ هـ) ئەڵێت : (تەماشای بارودۆخی هاوەڵانم کرد، جا نەمبینی فەزڵیان هەبێت بەسەر إبن المبارک تەنها بەوە نەبێت کە هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ بوون و لەگەڵی جەنگاون) .

١٠ - **إسماعيل بن عياش** (١٨١ هـ) ئەڵێت : (لەسەر ڕووی زەوی کەسێکی تێیدا نییە وەکو إبن المبارک، وە وانازانم الله تعالى تایبەتمەندیەکی باشی دروست کردبێت ئیللا پێیداوە) .

١١ - **يحيي بن يحيي الليثي** (٢٣٤ هـ) ئەڵێت : (لەلای مالک بووین، داوای مۆڵەتی هاتنەژوورەوە کرا بۆ عبدالله بن المبارک، جا مۆڵەتی درا، بینیمان مالک لە مەجلیسەکەدا شوێنی بۆ ئەکردەوە، پاشان لەپاڵ خۆیدا داینا، هەرگیز نەمبینیوە مالک لە مەجلیسەکەیدا شوێن بۆ کەسێک بکاتەوە جگە لە ئەو، جا خوێنەرەوەکە بەسەر مالک ـدا ئەیخوێندەوە و مالک یش جار جار پرسیاری لێ ئەکرد : مەزهەبی تۆ چییە لەمەدا؟ چیتان لەلایە لەم بابەتەدا؟ بینیم إبن المبارک وەڵامی ئەدایەوە، پاشان هەستا و چووە دەرەوە، مالک زۆر سەرسام بوو بە ئەدەبەکەی، پاشان مالک بە ئێمەی وت : ئەم إبن المبارک ە فەقیهی خۆراسانە) .

١٢ - **عبدالوهاب بن عبدالحكم** ئەڵێت : (پێم گەیشتووە کاتێک إبن المبارک وەفاتی کرد هارون الرشيد پێشەوای ئیمانداران وتی : گەورە و پێشەوای زانایان وەفاتی کرد) .



١ - مجاهد بن جبر ئەڵێت :

ئەم ئایەتانە : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ (٢) كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ (٣) إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِهِۦ صَفّٗا كَأَنَّهُم بُنۡيَٰنٞ مَّرۡصُوصٞ (٤) : ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە بۆچی شتێک ئەڵێن و ئەنجامی نادەن؟ کە شتێک ئەڵێن و ئەنجامی نادەن ئەوە الله توورە ئەکات، الله ئەوانەی خۆش ئەوێت کە وەکو دیوارێکی قورقوشمی لەپێناویدا شەڕ ئەکەن ﴾ (الصَّفِّ)

: لەسەر چەند ئەنسارییەک دابەزی کە عبدالله بن رواحة یان تێدابوو، لە دانیشتنێکدا وتیان : (ئەگەر بمانزانیایە کام کارە لەلای الله خۆشەویسترینە ئەوە ئەنجاممان ئەدا هەتا ئەمردین)، جا کاتێک ئەو ئایەتە دابەزی عبدالله بن رواحة وتی : (خۆم تەرخان ئەکەم لەپێناو الله هەتا ئەمرم)، دوای ئەوە شەهید کرا .

٢ - أبا الدرداء رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

(كار و كردەوەی باش بكەن پێش جەنگ و كوشتار، چونكە ئێوە بە كار و كردەوەكەتان جەنگ ئەكەن) .

---

: واتە تەقوای الله تان هەبێت پێش جەنگ و جيهاد چونكە الله تعالى بەپێی كار و كردەوەتان یارمەتیتان ئەدات، والله أعلم .

٣ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(كوژراو لە سێ پیاودا خۆی ئەبینێتەوە، لە پیاوێكی ئیماندار كە جیهاد ئەكات بە نەفس و ماڵی لەپێناو الله هەتا كاتێک ڕووبەڕووی دوژمن ئەبێتەوە شەڕیان لەگەڵ ئەكات هەتا ئەكوژرێت، ئەوە شەهیدێكی پوختی هەڵبژاردەی موخلیص ە، لەژێر خێمەی الله یە لەژێر عەرشەكەی، پێغەمبەران لەو شەهیدە تەنها بە یەک پلە بەرزترن .

وە لە پیاوێكی ئیمانداردا كە تاوان و هەڵەی كردووەتە ملی خۆی، وە جیهاد ئەكات لەپێناو الله بە نەفس و ماڵی خۆی هەتا كاتێک ئەگات بە دوژمن ئەجەنگێت لەگەڵیان هەتا ئەكوژرێت، جا ئەوە تاوان و هەڵەكانی

پاک ئەکاتەوە، چونکە شمشێر پاککەرەوەی تاوانە، وە لە هەر درگایەکەوە بیەوێت ئەکرێتە بەهەشتەوە، بەهەشت هەشت دەرگای هەیە، وە جەهەننەمیش حەوت دەرگا، وە هەندێکیان لەخوار هەندێکی ترەوەن .

وە لە پیاوێکی دووڕوودا لەپێناو الله بە ماڵ و نەفسی خۆی شەڕ ئەکات، هەتا کاتێک ئەگات بە دوژمن شەڕ ئەکات هەتا ئەکوژرێت، ئەوە بۆ جەهەننەمە چونکە شمشێر نیفاق لانابات و پاکی ناکاتەوە) .

٤ - مرة دەڵێت :

(لەلای عبدالله بن مسعود باسی کۆمەڵەیەک کرا کە لەپێناو الله دا کوژرابوون، عبدالله وتی : بابەتەکە بەو شێوەیە نییە ئێوە ئەیبینن و بۆی ئەچن، کاتێک کە دوو کۆمەڵەکە بەیەک گەیشتن - واتە موسوڵمانان و کافران - مەلائیکەکان دائەبەزن، جا ناوی خەڵکی ئەنووسن بەپێی پێگە و پلەکانیان : فلان کەس بۆ دنیا شەڕ ئەکات، وە فلان بۆ موڵک و سەروەت شەڕ ئەکات، وە فلان بۆ بەناوبانگ بوون شەڕ ئەکات، بەو شێوەیە، وە فلان یش لەپێناو بینینی ڕووی الله شەڕ ئەکات، جا هەر کەسێک لەپێناو الله شەڕ بکات ئەوە لە بەهەشتدایە) .

٥ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(نمونەی موجاهید لە پێناو الله دا، وە الله ش ئەزانێت کێ جیهاد ئەکات لە پێناویدا، نمونەی نوێژکەرێکی ڕۆژووگری بەخشوعە کە زۆر لە ڕکوع و سوجدەدا ئەمێنێتەوە) ،

: واتە هەردووکیان وەکو یەکن، ئەمەش پلەی موجاهید پیشان ئەدات .

٦ - طاوس ئەڵێت :

پیاوێک بە رسول الله ی ﷺ وت : من ئەجەنگم لەپێناو الله تعالى، وە حەزیش ئەکەم شوێن و پلەم لەلای خەڵکی بینراو و زانراو بێت، رسول الله ﷺ بە هیچ شتێک وەڵامی نەدایەوە هەتا ئەم ئایەتە دابەزی | **فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا** : هەر کەسێک ئومێدی گەیشتنەوەی بە پەروەردگاری خۆی هەیە با کار و کردەوەی چاک ئەنجام بدات، وە لە پەرستنی پەروەردگاری خۆیدا هیچکەس نەکات بە شەریکی | (**الكهف** : ١١٠) .

٧ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(موجاهید لەپێناو الله وەکو ڕۆژووگرێک وایە بە شەو و ڕۆژ ئایەتەکانی الله بڵێتەوە لە نوێژدا . . . ) .

٨ - الحسن البصري ئەڵێت :

(رسول الله ﷺ سوپایەکی نارد کە عبدالله بن رواحة ی تێدا بوو، سوپاکە بەیانیان کردەوە ڕۆیشتن، وە عبدالله بن رواحة هەستا هەتا نوێژ لەگەڵ رسول الله دا ﷺ بکات، دوای ئەوەی رسول الله ﷺ لە نوێژەکەی تەواو بوو، فەرمووی : (ئەی إبن رواحة، تۆ لە سوپاکەدا نەبوویت؟)

وتی : بەڵێ ئەی رسول الله ﷺ، بەس پێم خۆش بوو لەگەڵ تۆدا نوێژ ئەنجام بدەم، وە شارەزای شوێنەکەشیانم، جا ئەڕۆم و پێیان ئەگەمەوە.

فەرمووی : (سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر هەموو ئەوەی لەزەویدایە بیبەخشیت ناگەیت بە فەزڵی ئەو بەڕێکەوتنەی بەیانیان) .

٩ - معاوية بن قرة ئەڵێت :

(ئەوترا : هەموو دینێک گۆشەگیری و خەڵوەتگیری خۆی هەیە، وە خەڵوەتگیری ئەم ئوممەتەش جیهادە لە پێناو الله) .

---

: بۆیە جیهادی ناوبردووە بە خەڵوەتگیری چونکە هەردووکیان واز لە ئیسراحەت و لەزەت و خۆشیەکانی دنیا ئەهێنن لەپێناو الله تعالی، والله أعلم .

١٠ - إبن لهيعة ئەڵێت :

عمارة بن غزية هەواڵی پێدام کە باسی گەڕان و سیاحەت کرا لەلای رسول الله ﷺ و ئەویش فەرمووی : (الله ئەوەی بۆ گۆڕین بە جیهاد لەپێناوی الله، وە تەکبیرە کردن لەکاتی سەرکەوتن بە شوێنێکی بەرزدا) .

١١ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(دەرچوونێک لە نیوەڕۆ یان بەیانیدا لەپێناو الله - مەبەستی جیهادە - باشترە لە دنیا و ئەوەی تێیدایەتی، یان ئەوەی لەسەریەتی) .

١٢ - **أبي هريرة** رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

باسی شەهیدەكان كرا لەلای رسول الله ﷺ جا فەرمووی : (زەوی لە خوێنی وشک نابێتەوە هەتا هاوسەرەكانی بەپیریەوە دێن وەكو دایكێک كە بێچووەكەیان لە بیابانانێكدا ون كردبێت، وە هەر یەكێكیان پارچە جلێكی تایبەتی بەدەستەوەیە كە باشترە لە دنیا و ئەوەی تێیدایەتی) .

١٣ - **عبدالله بن عمير الليثي** ئەڵێت :

كاتێک دوو كۆمەڵەكە دەستیان كرد بە شەڕ - واتە لە جیهاد دا - الله حۆریەكان ئەنێرێتە ئاسمانی دنیا، ئەگەر بەرەپێشچوونی - موجاهیدەكەیان - بینی ئەڵێن (اللهم جێگیری بكە)، ئەگەر - موجاهیدەكە - پاشگەز ببێتەوە خۆیانی لێ دائەشارن، وە ئەگەر كوژرا ئەوە دائەبەزن بۆلای و تۆزی سەر دەموچاوی ئەسڕن و ئەڵێن : (اللهم ئەوە خۆڵاوی بكە كە ئەمی خۆڵاوی كرد) .

١٤ - **المطلب بن حنطب** ئەڵێت :

(شەهید ژوورێكی هەیە مەوداكەی نێوان صنعاء و الجابية يە، سەقفەكەی مرواری و یاقوتە، وە ناوەوەی میسک و كافورە، مەلائیكەكان ئەڕۆن بۆلای بە دیاریەكەوە لەلایەن الله تبارک و تعالى وە، مەلائیكەكان

ناچنە دەرەوە هەتا مەلائیکەکانی تر لە دەرگایەکی ترەوە بە دیاریەکەوە لەلایەن پەروەردگاریانەوە دێن) .

---

: صنعاء شارێکە لە یەمەن، الجابية شارێکە لە شام .

١٥ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(ئەگەر قورس نەبووایە لەسەر ئوممەتەکەم، یان فەرمووی لەسەر خەڵکی، ئەوە حەزم نەئەکرد بەجێ بمێنم لە هەر کۆمەڵە سەربازێک کە لەپێناو الله دەرئەچن، بەڵام ئەوەندەم نییە ئامادەیان بکەم بۆی، وە خۆشیان ئەوەندەیان نییە کە خۆیان ئامادە بکەن بۆی، وە لەسەریان قورسە من بڕۆم و ئەوانیش لەدوای من بمێننەوە، وە هیواخوازبووم لەپێناو الله بجەنگم بکوژرێم پاشان زیندوو بکرێمەوە، وە بکوژرێم پاشان زیندوو بکرێمەوە، وە پاش ئەوە بکوژرێم) .

---

: (ئەوەندەم نییە ئامادەیان بکەم بۆی، وە خۆشیان ئەوەندەیان نییە کە خۆیان ئامادە بکەن بۆی) واتا من ئەوەندە کەرەستەی جەنگیم نییە هەتا بیاندەمێ جیهادی پێ بکەن، وە خۆشیان ئەوەندەیان نییە هەتا جیهادی پێ بکەن، والله أعلم .

١٦ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (هەرگیز تۆز ێک لەپێناو الله دا و دوکەڵی جەهەننەم لە کونەلووتی بەندەیەکی موسوڵماندا کۆنابێتەوە)

.

: (تۆز ێک لەپێناو الله دا) مەبەستی لەو تەپوتۆزەیە موجاهید هەڵیئەمژێت لەکاتی جیهادکردندا، والله أعلم .

١٧ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، هیچ دەموچاوێک نییە زەرد بێت وە هیچ پێیەک نییە خۆڵاوی بێت لە کارێکدا کە بەدەستهێنانی پلە بەرزەکانی بەهەشتی تێدا مەبەستە لەدوای نوێژە فەرزەکان وەکو جیهاد کردن لە پێناو الله دا بێت، وە هیچ شتێک تەرازووی بەندە قورس ناکات وەکو ئاژەڵێکی کە لەپێناو الله مردار ئەبێتەوە، یان لەپێناو الله بۆ جەنگ بەکاریئەهێنێت) .

١٨ - أبو مصبح ئەڵێت :

(غەزامان لەگەڵ مالک بن عبدالله الخثمعي كرد لە زەوی ڕۆم، پیاوێک پێشی خەڵکی کەوت، پاشان دابەزی و بەپێی ئەڕۆیشت و پێشڕەویی ئاژەڵەکەی ئەکرد، مالک پێی وتی : ئەی باوکی عبدالله، ئایا سواری - ئاژەڵەکەت - نابیت؟

وتی : بیستم رسول الله ﷺ ئەیفەرموو : (هەر کەسێک پێیەکانی تۆزاوی ببن ساتێک لە ڕۆژ لەپێناو الله دا، ئەوە حەرام ئەبن لەسەر ئاگر)، وە باش ئەبم لەگەڵ ئاژەڵەکەم هەتا بێپوێیست بم لە خەڵکی، أبو مصبح وتی : پاش ئەوە خەڵکی دابەزین، هەرگیز نەمبینیبوو هێندەی ئەو ڕۆژە خەڵکی لەسوار سواریەکەیان دابەزن .

١٩ - سلمان الفارسي رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

(ئەگەر دڵی کەسێک لەپێناو الله بلەرزێت - بترسێت - ئەوە تاوانەکانی هەڵئەوەرێت وەک چۆن بۆڵە خورما لە دار خورما لێ ئەبێتەوە) .

٢٠ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(سوێند بەوەی نەفسی محمد ی بەدەستە هیچ کەسێک لەپێناو الله بریندار ناکرێت وە الله ئەزانێت کێ لەپێناویدا بریندار ئەکرێت ئیللا لەسەر

شێوەی برینداریەکەی دێت لە ڕۆژی قیامەتدا، - برینەکە - ڕەنگی خوێنە، وە بۆنەکەی بۆنی میسک ە) .

**٢١ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :**

(الله زەمانی ئەو موجاهیدەی کردووە کە لەماڵی خۆی دەرئەچێت لەکاتێکدا بۆ هیچ شتێک دەرنەچووە تەنها بۆ جیهادکردن لەپێناو الله و بەڕاستخستنەوەی وتەکەی نەبێت کە بیخاتە بەهەشتەوە یان بیگەڕێنێتەوە بۆ ئەو ماڵەی لێی دەرچووە بەو پاداشتەی بەدەستی ئەهێنێت یان بە غەنیمەتەوە) .

**٢٢ - معاذ بن جبل رضي الله عنه ئەفەرمووێت :**

( - لە قیامەتدا - بانگکەرێک بانگ ئەکات ئەڵێت : کوان ئەوانەی لەپێناو الله دا ئازاریان چەشتووە؟ جا کەس هەڵناسێتەوە تەنها موجاهیدەکان نەبێت) .

**٢٣ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :**

(ئەگەر کەسی ئازا و ترسنۆک شەڕ بکەن ئەوە ترسنۆکەکەیان پاداشتی زیاترە، وە ئەگەر کەسی ڕەزیل و دەستکراوە - ماڵیان - بەخشی ئەوە ڕەزیلەکەیان پاداشتی زیاترە) .

٢٤ - **سعيد بن جبير** لە تەفسیری ئایەتی :

| **وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَنْ شَاءَ اللَّهُ** : فوو بە کەڕنادا ئەکرێت و ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویە لەناو ئەچن تەنها ئەوە نەبێت کە اللە خۆی بیەوێت لەناو نەچێت | (**الزمر** : ٦٨) .

ئەڵێت : (ئەوانە شەهیدەکانن، ئەوانەن کە اللە جیای کردوونەتەوە لە دەوری عەرشەکەی خۆی، شمشێر بە کارامەیی بەکار ئەهێنن) .

٢٥ - **رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت :

(ئەو سێ یەکەمین کەسەی ئەچنە بەهەشتەوە، وە ئەو سێ یەکەمین کەسەی ئەچنە جەهەننەمەوە پێم پیشان دران، ئەو سێ یەکەمین کەسەی ئەچنە بەهەشتەوە بریتین لە : شەهید، وە بەندەیەک کە بە باشی عیبادەت ئەکات و دڵسۆزە بۆ خاوەنەکەی, وە داوێن پاکێکی پاکیزەی خاوەن منداڵ، ئەو سێ یەکەمین کەسەی ئەچنە جەهەننەمەوە بریتین لە : دەسەڵاتدارێکی خۆسەپێن، وە خاوەن ماڵ و سامانێک کە حەقی خۆی لێ نادات، وە هەژارێکی لووتبەرز) .

**٢٦ - أبي الأحمس** ئەڵێت :

(پێم گەیشت کە أبا ذر وتوویەتی : (ئەو سێ کەسەی الله خۆشیئەوێن، وە ئەو سێ کەسەی الله ڕقی لێیانە)، پێی گەیشتم وتم : ئەی أبا ذر چیت گێڕاوەتەوە؟ پێمگەیشتووە لە رسول الله ﷺ ـەوە ئەیگێڕیتەوە، حەزم کرد لە خۆتەوە گوێم لێبێت .

وتی : چ شتێک؟

وتم : (ئەو سێ کەسەی الله خۆشیئەوێن، وە ئەو سێ کەسەی الله ڕقی لێیانە) .

وتی : (وتم و گوێت لێ بوو) .

وتم ئەو سێ کەسە کێن کە الله خۆشی ئەوێن؟

وتی : (پیاوێک لە کۆمەڵە یان سوپایەکی بچووکدایە، جا هاوەڵەکانی ئەکشێنەوە، ئەویش خۆی ڕائەگرێت و بەرگە ئەگرێت هەتا ئەکوژرێت، یان هەتا الله سەری ئەخات . . . ) .

**٢٧ - رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت :

(باشترین شەهیدەکان لەلای الله ئەوانەن کە لەپێشەوەی ڕیزن، ئاوڕ بۆ دواوە نادەنەوە هەتا ئەکوژرێن، ئەوانە لە ژوورە بەرزەکانی بەهەشت پاڵ ئەدەنەوە و خۆشی ئەبینن، وە پەروەردگارت بۆیان پێئەکەنێت، ئەگەر پەروەردگارت بۆ کۆمەڵەیەک پێبکەنێت لێپرسینەوەیان لەسەر نییە) .

**٢٨ - عبدالله بن عمرو** رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

(پێتان ڕابگەیەنم دەربارەی باشترین شەهیدەکان لەلای الله لە ڕۆژی قیامەتدا؟ ئەوانەن کە لە ڕیزدا ئەوەستن، کاتێک ڕووبەڕووی دوژمنەکانیان ئەبنەوە و بەلای ڕاست و چەپدا لا ناکەنەوە، شمشێرەکانیان لەسەر گەردنیان داناوە، ئەڵێن : ئەی پەروەردگارم من ئەمڕۆ حەقی تۆ ئەدەمەوە لە بەرامبەر ئەو ڕۆژانەی پێشتر بەڕێم کردووە، جا ئەوکاتە ئەکوژرێت، جا ئەمە لەو شەهیدانەیە کە لە ژوورە بەرزەکانی بەهەشت چێژ ئەبینن لە هەرکوێ بیانەوێت) .

**٢٩ - کعب** ئەڵێت :

(سوێند بە الله خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا بەم شێوەیە تەماشای شەهیدەکان ئەکەن)، پاشان سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان .

: واتە شەهیدەکان ئەوەندە پلەیان بەرزە خەڵکی ئەبێت تەماشای سەرەوەیان بکەن بۆ ئەوەی بیانبینن .

٣٠ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(الله شەهیدەکانی پارێزراو کردووە ئەگەر بکوژرێن یان لەسەر ڕاخەرەکەیان بمرن) .

: واتە الله تعالى شەهیدەکانی پارێزراو و ئەمین کردووە لە سزای خۆی ئەگەر بە هەر شێوەیەک بمرن، والله أعلم .

٣١ - ثابت البناني ئەڵێت :

(ڕۆژێک عكرمة بن أبي جهل لەسەر ئەسپەکەی هاتە خوارەوە، خالد بن الوليد پێی وت : وا مەکە، چونکە کوشتنی تۆ لەسەر موسوڵمانان قورسە، عكرمة وتی : (وازم لێ بهێنە خالد، تۆ ڕابردووی باشت هەیە لەگەڵ رسول

الله ﷺ، من و باوکیشم لە توونددترین کەسەکان بووین لەسەر رسول الله ﷺ)، جا ڕۆیشت هەتا کوژرا) .

---

: عکرمة رضي الله عنه لە جەنگی یەرموکدا شەهید کرا .

## ٣٢ - عبدالرحمن بن الحارث ئەڵێت :

رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەمشەو لە خەومدا بینیم وەکو بڵێیت ئەبو جەهل هات بۆلام و بەیعەتی دا پێم) .

کاتێک خالد بن الولید موسوڵمان بوو وترا : الله خەوەکەتی بەڕاستخستەوە ئەی رسول الله، ئەوە بۆ موسوڵمان بوونی خالد بوو .

فەرمووی : (بۆ جگە لە ئەوە)، هەتا ئەو کاتەی عکرمة بن أبي جهل موسوڵمان بوو، ئەوە بەڕاستخستنەوەی خەوەکەی بوو .

٣٣ - إبن أبي مليكة ئەڵێت :

(عكرمة بن أبي جهل موسحەف - قورئان - ی ئەگرت و لەسەر دەموچاوی دایئەنا و ئەگریا، ئەیفەرموو : ' کتێبی پەروەردگارم، وە کەلامی پەروەردگارم ' ) .

٣٤ - مجاهد بن جبر لە تەفسیری ئایەتی :

| وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا ۚ بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ : وا مەزانن ئەوانەی لە ڕێگای الله دا کوژراون مردوون، بەڵکو لەلای پەروەردگاریان زیندوون ڕزق و ڕۆزیان پێ ئەدرێت | (آل عمران : ١٦٩) .

ئەڵێت : (لە بەرهەمی بەهەشتیان پێ ئەدرێت، بۆنی - بەهەشت - ئەکەن و لەناویشیدا نین) .

٣٥ - إبن عباس رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

(لە بەهەشت باڵندەی سەوزی تێدایە ڕۆحی شەهیدەکان لەناویدا خۆشی ئەبینن) .

٣٦ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(کاتێک براکانتان کوژران لە جەنگی ئوحود، الله ڕۆحەکانی کردنە ناو باڵندەی سەوزەوە، ئەڕۆشتن بۆلای ڕووبارەکانی بەهەشت، وە لە بەرهەمەکانیان ئەخوارد، ئەڕۆشتن بۆلای چرای ئاڵتوونی لەژێر سێبەری عەرشدا، جا کاتێک ئەم هەموو خواردنە خۆشە و شوێنە باشەیان بینی وتیان : (خۆزگە براکانمان بیانزانیبا الله بە چ شتێک ڕێزی لێ گرتووین و لە چ شوێنێکداین، بۆ ئەوەی کەمتەرخەمی نەکەن لە جیهاد کردن وە لە کاتی کوشتاردا نەگەڕێنە دواوە)، الله فەرمووی : (من لەجێی ئێوە پێیان ڕائەگەیەنم، جا الله تعالى ئەمەی دابەزاند : | **وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا ۚ بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ** : وا مەزانن ئەوانەی لە ڕێگای الله دا کوژراون مردوون، بەڵکو زیندوون لەلای الله ڕزق و ڕۆزیان پێ ئەدرێت | **(آل عمران : ١٦٩)** .

٣٧ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(کاتێک شەهید شەهید ئەکرێت الله جوانترین لاشەی بۆ دروست ئەکات، پاشان فەرمان بە ڕۆحەکەی ئەکات و ڕۆحەکەی ئەڕواتە ناوی، جا تەماشای ئەو لاشەیەی ئەکات کە لێی دەرچووە چیی لێ ئەکەن، وە

تەماشای ئەو کەسانەی دەوروبەری ئەکات کە دڵتەنگن بۆی، وا ئەزانێت ئەوانە گوێیان لێیەتی و ئەیبینن، پاشان ئەڕوات بۆلای هاوسەرەکانی) .

٣٨ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(هەر کەسێک پێی بخاتە ناو ئاوزەنگی ئاژەڵەکەی و بچێتە دەرەوە لە ماڵەوە لەپێناو الله، ئەگەر ئاژەڵێک پێوەی بدات، یان ئاژەڵەکەی بیکەوێنێت و ملی بشکێت، یان بە هەر جۆرێکی تری مردن بمرێت ئەوە شەهیدە) .

٣٩ - طارق بن شهاب ئەڵێت :

(باسی شەهیدەکان کرا لەلای عبدالله بن مسعود وترا : (فڵانە کەس ئەو ڕۆژە ئاوا و ئاوا شەهید کرا، وە فیسار کەس ئەو ڕۆژە بەو شێوە و بەو شێوەیە شەهید کرا) .

عبدالله فەرمووی : (ئەگەر شەهیدەکانتان تەنها ئەوانە بن کە ئەکوژرێن ئەوە شەهیدەکانتان کەمن، بەڵکو ئەو کەسەی لە چیاکان بەرئەبێتەوە، وە ئەوەی ئەخنکێت لە دەریاکاندا، وە ئەوەی ئاژەڵی دڕندە ئەیخوات ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا لەلای الله شەهیدن) .

**٤٠ - أبو هريرة** رضي الله عنه فەرمووی :

(ئایا کەسێک لە ئێوە ئەتوانێت بە بەردەوامی نوێژ بکات، وە ڕۆژوو بگرێت و ڕۆژووەکەی نەشکێنێت هەتا ماوە؟

پێی وترا : ئەی ئەبو هریرة، جا کێ ئەمەی پێ ئەکرێت؟

فەرمووی : (سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە یەک ڕۆژی موجاهید لە پێناو الله دا لەوە باشترە) .

**٤١ - عكرمة** ئەڵێت :

(عمرو بن الجموح پیاوێکی پیر و پەکەوتەی شەل بوو لە ئەنسارییەکان، کاتێک رسول الله ﷺ بۆ جەنگی بەدر دەرچوو بە کوڕەکانی وت : (منیش ببەن بۆ ئەوێ)، باسی شەلێتی و حاڵی بۆ رسول الله ﷺ کرا، جا مۆڵەتی پێدا بمێنێتەوە، کاتێک ڕۆژی جەنگی ئوحود هات خەڵکی دەرچوو، بە کوڕەکانی وت : (منیش ببەن بۆلایان)، وتیان رسول الله ﷺ مۆڵەتی پێداویت، وتی : (هیهات، لە ڕۆژی بەدر لە بەهەشت بێبەشتان کردم، وە ئەتانەوێت ڕێگریم لێ بکەن لە ڕۆژی ئوحود!) جا دەرچوو، کاتێک کۆمەڵەی موسوڵمانان و کافران گەیشتن بە یەک بە رسول الله ی ﷺ وت : (ئەگەر ئەمڕۆ بمرم، بەم شەلێتیەی خۆمەوە قاچ ئەخەمە بەهەشت؟)،

فەرمووی : (بەڵێ)، وتی : (سوێند بەوەی کە بە حەق ناردوویتی إن شاء الله ئەمڕۆ پێ ئەخەمە بەهەشتەوە)، بەندەیەکی لەگەڵدا بوو پێی ئەوترا سلیم، پێی وت : بڕۆرەوە بۆلای خێزانەکەت، بەندەکە وتی : (ئەگەر ئەمڕۆ لەگەڵ تۆدا بکوژرێم باشتر نییە؟)، وتی : (مادەم وایە پێشکەوە)، جا شەڕی کرد هەتا کوژرا، پاشان خۆشی جەنگا هەتا کوژرا .

**٤٢ - سليمان بن أبان ئەڵێت :**

(کاتێک رسول الله ﷺ بەڕێکەوت بۆ بەدر سعد بن خيثمة و باوکی پێکەوە ویستیان دەربچن، ئەوەیان باس کرد بۆ رسول الله ﷺ، فەرمانی کرد بەوەی کە تەنها یەکیان دەربچن، تیروپشکیان کرد و سعد دەرچوو، باوکی وتی : کوڕی خۆم ئەو چاکەیەم لەگەڵ بکە - واتە با من لەجیاتی تۆ بڕۆم - ، کوڕەکە وتی : باوکە گیان ئەوە بەهەشتە، ئەگەر بێجگە لەوە بووایە ئەو چاکەیەم لەگەڵ ئەکردیت، سعد لەگەڵ رسول الله ﷺ دەرچوو بۆ جەنگی بەدر و کوژرا،ساڵی پاش ئەوە خيثمة لە جەنگی ئوحود کوژرا .

٤٣ - أنس بن مالك رضي الله عنه فەرمووی :

(کاتێک حرام بن ملحان - خاڵی بوو - پێکرا لە ڕۆژی بئر معونة، خوێنەکەی بڵاوەپێکرد بەسەر دەموچاو و سەری و پاشان وتی : (سوێند بە پەروەردگاری کەعبە بردمەوە) .

٤٤ - أنس بن مالك رضي الله عنه فەرمووی :

(أبا طلحة لە بەردەم رسول الله ﷺ تیری هەڵئەدا، جا رسول الله ﷺ لە پشتەوە سەری بەرز ئەکردەوە بۆ ئەوەی ببینێت تیرەکەی چی ئەپێکێت، أبا طلحة خۆی بەرز ئەکردەوە و ئەچووە بەردەم رسول الله ﷺ ئەیپاراست و ئەیوت : (بەم شێوەیە ئەی پێغەمبەری الله، الله بمکات بە فیدات، با گەردنی من لەجیاتی گەردنی تۆ بپێکرێت) .

٤٥ - سعيد بن المسيب ئەڵێت :

(عبدالله بن جحش لە ڕۆژی جەنگی ئوحود فەرمووی : (ئەی پەروەردگارم سوێندت ئەدەم کە بگەین بە دوژمن، جا کە گەیشتین بە دوژمن بمکوژن، پاشان سکم هەڵبدڕن و، جەستەم بشێوێنن، جا کە گەیشتمەوە بە تۆ لێت پرسیم بۆ وات لێکراوە بڵێم لەپێناو تۆدا)، گەیشتن بە دوژمن و کوژرا و بەو شێوەیەی لێکرا) .

٤٦ - موسى بن طلحة بن عبيدالله ئەڵێت :

(طلحة گەڕایەوە - لە جەنگی ئوحود - بە سی و حەوت یان حەفتا و سێ برینەوە، هەندێکی هی شمشێر و هەندێکی هی تیر و ڕم بوو، چواریەکی برینەکان لە ناوچاویدا بوو، وە دەماری کلۆکی بڕابوو، وە پەنجەی دۆشاومژەی لەکارکەوتبوو) .

٤٧ - عبدالرحمن بن عوف رضي الله عنه بەڕۆژوو بوو و خواردنی بۆ هێنرا، فەرمووی : (مصعب بن عمير كوژرا، لەكاتێكدا لەمن باشتر بوو، لە پارچە قوماشێكدا كفن كرا ئەگەر سەری داپپۆشرایە قاچی دەرئەكەوت، وە ئەگەر قاچی داپپۆشرایە سەری دەرئەكەوت، وە حمزة كوژرا لەكاتێكدا لە من باشتر بوو، پاش ئەوە - ڕزق و ڕۆزی - دنیا بۆ ئێمە فراوان بوو) یان وتی : (لەدنیا پێمان درا ئەوەی كە پێمان درا، وە ئەترسم چاكەكانمان بۆمان پێشخرابێت) پاشان ئەوەندە گریا هەتا وازی لە خواردنەكە هێنا) .

٤٨ - سعيد بن المسيب ئەڵێت :

(لە كاتی خەلافەتی ئەبو بەكر دا بیلال خۆی ئامادە كرد بڕوات بۆ شام، ئەبو بەكر رضي الله عنه پێی وت : (ئەی بیلال وام نەئەبینی بەجێمان بهێڵیت بەم حاڵەوە، بریا لەگەڵمان بمایتایەتەوە و یارمەتیت بدایینایە) .

- بيلال - وتی : (ئەگەر لەپێناو الله ئازادت کردووم لێم بگەڕێ با بڕۆم بۆلای الله، وە ئەگەر لەبەر خۆت ئازادت کردووم لای خۆت بمهێڵەرەوە) .

جا مۆڵەتی دا، دەرچوو بۆ شام و لەوێ وەفاتی کرد .

٤٩ - **أبو طلحة** رضي الله عنه ئەم ئایەتەی خوێندەوە : | **انْفِرُوا خِفَافًا وَثِقَالًا** : بە گەنج و پیرەوە دەربچن بۆ جیهاد | (**التوبة**) .

پاشان وتی : الله تبارک و تعالى فەرمانی پێ کردووین بە گەنج و پیرەوە دەربچین، ئامادەم بکەن .

کوڕەکانی وتیان : ڕەحمەتی الله ت لێبێت لە سەردەمی رسول الله ﷺ و أبو بکر و عمر جیهادت کرد، ئێستا ئێمە لەجیاتی تۆ جیهاد ئەکەین .

أبو طلحة جیهادی دەریایی کرد و وەفاتی کرد - لەناو کەشتی - ، بەدوای دوورگەیەکدا گەڕان هەتا بینێژن تیایدا بەڵام نەیانتوانی هەتا پاش نۆ ڕۆژ لە وەفاتی نەبێت وە لاشەی تێکنەچووبوو .

٥٠ - **رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت :

(الله منی لە پێش قیامەت بە شمشێر ناردووە، وە ڕزقی منی لەژێر سێبەری ڕمەکەمدا داناوە، وە سەرشۆڕی و بچووکێتی تووشی ئەو کەسە

ئەکات کە پێچەوانەی من ئەکات، وە هەر کەسێک خۆی بچوێنێت بە گەلێک ئەوە لەوانە) .

**٥١ - خالد بن الوليد** رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

(هیچ شەوێک نییە کە تێیدا بووکێکم بە دیاری پێ بدرێت - واتە ئافرەتێک بخوازم - ، یاخود مژدەم پێ بدرێت بەوەی بووم بە خاوەنی منداڵێکی کوڕ خۆشەویستتر بێت لەلام لە شەوێک کە زۆر سارد بێت و بەستەڵەکێکی زۆری هەبێت و منیش لە سوپایەکدا بم بەیانی تێدا بکەمەوە بەسەر دوژمندا) .

**٥٢ - أبي جهم بن حذيفة العدوي** وتی :

(لە ڕۆژی جەنگی یەرموکدا بەدوای کوڕە مامەکەمدا ئەگەڕام و تورەکەیەک ئاو و جامێکم پێبوو و وتم : (ئەگەر لە ژیاندا مابێت ئەوە لە ئاوەکە پێی ئەدەم و دەموچاوی پێ ئەسڕم)، کاتێک لێی نزیک بوومەوە دەنگی ناڵەی ئەهات، وتم : (ئاوت پێ بدەم؟)

بە ئاماژەکردن وتی بەڵێ، لەولاوە پیاوێک وتی : ئاه ! ، کوڕە مامەکەم ئاماژەی بۆ کردم کە بڕۆم بۆلای، کە ڕۆشتم بۆلای بینیم هشام بن عاص ی برای عمرو بن عاص ە، پێم وتی : (ئاوت پێ بدەم؟)

بە ئاماژەکردن وتی بەڵێ، لەولاوە پیاوێک وتی : ئاهـ ! ، هشام ئاماژەی بۆ کردم کە بڕۆم بۆ لای، هەتا گەیشتمە لای بینیم وەفاتی کردووە، پاشان کە گەڕامەوە بۆلای هشام بینیم ئەویش وەفاتی کردووە، پاشان هاتمەوە بۆلای کوڕە مامەکەم بینیم ئەویش وەفاتی کردووە .

٥٣ - الحسن البصري لە تەفسیری ئایەتی | وَكَأَيِّنْ مِنْ نَبِيٍّ قَاتَلَ مَعَهُ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ | (آل عمران : ١٦٤) .

ئەڵێت : (زانایانی خاوەن صبر) وە (تەقوادارانی خاوەن صبر) .

٥٤ - أنس بن مالك رضي الله عنه ئەفەرموێت :

(ڕۆژی جەنگی یەمامە تێپەڕیم بەلای ثابت بن قيس بن شماس دا و بۆنی لەخۆی ئەدا .

وتم : (مامە، ئایا نابینیت موسوڵمانان تووشی چی بوون و تۆش لێرەیت ! ) .

زەردەخەنەیەکی کرد و وتی : (هەر ئێستا ئەی برازاکەم) .

چەکەکەی هەڵگرت و سوار ئەسپەکەی بوو هەتا چووە لای ڕیزی شەڕکەران و وتی : ئۆف لەمانە چی ئەکەن، وە بە دوژمنەکانی وت : ئۆف لە

ئێوە و ئەوانەشی کە ئەیانپەرستن، ڕێی ئەسپەکەم بکەنەوە تا بڕۆمە گەرمەی شەڕەکەوە .

پاشان جەنگا هەتا کوژرا) .

**٥٥ - موسى بن أنس بن مالك** وتی :

(کاتێک ئەم ئایەتە دابەزی : | **يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَنْ تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنْتُمْ لَا تَشْعُرُونَ** | **(الحجرات : ٢)** .

ثابت بن قیس لەماڵەوە دانیشت و وتی : (خۆم وا ئەبینم دەنگم بەرز کردبێتەوە بەسەر رسول الله دا ﷺ) .

رسول الله ﷺ غەریبی کرد و پرسیاری لەبارەوە کرد، کەسێک وتی : (ئەگەر ئەتەوێت بۆت ئەپرسم ئەی رسول الله ﷺ) جا هات بۆ لای - ثابت - بینی خەمباری بە دەموچاویەوە دیارە .

پێی وت : (رسول الله ﷺ بیرت ئەکات و پرسیارت لەبارەوە ئەکات) .

ثابت وتی : (من دەنگم بەرز کردەوە بەسەر رسول الله دا ﷺ هەتا ئەم ئایەتە دابەزی، وە من لە ئەهلی ئاگرم) .

پیاوەکە ڕۆیشتەوە بۆلای رسول الله ﷺ و ئەوەی پێڕاگەیاند کە ثابت وتی .

پاشان پیاوەکە دووبارە بە مژدەیەکی گەورەوە هاتەوە بۆلای و پێی وت : (تۆ لە ئەهلی ئاگر نیت، بەڵکو لە ئەهلی بەهەشتیت) .

**٥٦ - إسماعیل بن ثابت** وتی :

ثابت بن قیس الأنصاري وتی : (ئەی رسول الله، ئەترسم لەوەی کە تیاچووبێتم) .

فەرمووی : (بۆچی؟) .

وتی : (الله ڕێگری کردووە لێمان لەوەی کە سوپاس بکرێین لەسەر شتێک کە نەمان کردووە، منیش حەزەکەم سوپاسم بکرێم، الله ڕێگری لێمان کردووە لە لووتبەرزی و خۆبەزلزانی، منیش حەزم لە جوانیە - واتە جلی جوان والله أعلم - ، وە الله تبارک و تعالی ڕێگری لێ کردووین لەوەی دەنگمان بەرز بکەینەوە بەسەر دەنگتدا، وە منیش پیاوێکم دەنگم بەرزە) .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەی باوکی ثابت ئایا ڕازی ئەبیت بەوەی بە سەربەرزی بژیت، وە بە شەهیدی بکوژرێیت و الله بتخاتە بەهەشتەوە؟) .

وتی : (بەڵێ ئەی رسول الله) .

جا بە سەربەرزی ژیا، وە لە ڕۆژی جەنگ کردن لەگەڵ موسەیلەمەی درۆزندا بە شەهیدی کوژرا .

**٥٧ - مقسم مولى إبن عباس ئەڵێت :**

(کاتێک من لەگەڵ پیاوێکدا دانیشتبووم لە بیت المقدس کەسێک هات بەرەوڕوومان، هاوەڵەکەی من پێی وت : (بەخێربێیت أبو إسحاق)، کاتێک پیاوەکە دانیشت وتم بە هاوەڵەکەم : (ئەمە کێیە؟)

وتی : (كعب الأحبار)

پێمان وت : (قسەمان بۆ بکە ڕەحمەتی الله ت لێبێت) .

وتی : (وای لێدێت تاوان و گوناه ئەگات بەوەی بەندە شەریک بۆ الله عز وجل دابنێت، وە دایکی خۆی بخوازێت، وە چاکە و خێر ئەگات بەوەی خوێنی بەندە بڕژرێت لەپێناو الله عز وجل .

وە شەهیدەکان سێ جۆرن :

- کەسێک لەماڵ دەرئەچێت - بۆ جیهاد - حەزی لە شەهیدبوونە، وە حەزی لە گەڕانەوەشە، جا الله عز وجل تیرێک ئەکات بە دیاری بۆی، لەگەڵ یەکەم دڵۆپەی خوێنیدا الله تبارک و تعالى لە هەموو تاوانەکانی

خۆش ئەبێت، وە بە هەموو دڵۆپەیەک لە خوێنی پلەیەک لە بەهەشت بەرزی ئەکاتەوە هەتا کۆتا دڵۆپە خوێنی لێ دێتە دەرەوە . . . ) .

٥٨ - عثمان بن أبي سودة ئەڵێت :

(پێمان گەیشتووە دەربارەی ئەم ئایەتە : | وَالسَّابِقُونَ السَّابِقُونَ | (الواقعة : ١٠) .

: یەکەمین ئەو کەسانەن کە ئەڕۆن بۆ مزگەوت، وە یەکەمین ئەو کەسانەن کە دەرئەچن لەپێناو الله - جیهاد ئەکەن - ) .

٥٩ - أبا جحيفة وتی :

(کاتێک بەڕێوە بووین بۆ مهران، پیاوێکی الأزدي مان لەگەڵ بوو پێی ئەوترا أبو أثابة .

ئێمە وتمان : ئەمە بێئۆقرە و ترسنۆکە .

وتی : نەخێر، بەڵکو أثابة م - واتە باوکی - بەجێهێشت لەم گەشتە، ئەمویست لەگەڵمدا بووایە و پێکەوە بڕۆیشتینایەتە بەهەشتەوە .

٦٠ - سعد وتی :

(ڕۆژی أبي عبيد ڕۆيشتم بەسەر پردێکدا پياوێک دەستەکان و قاچەکانی بڕابوون و ئەیوت : | مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقًا | (النساء : ٦٩) .

هەندێک لەوانەی بەلایدا تێپەڕین پێیان وت : تۆ کێیت؟

وتی : پیاوێکم لە ئەنصاریەکان .

---

: (ڕۆژی أبي عبيد) ئەو ڕۆژەیە کە تێیدا أبي عبيد بن مسعود الثقفي ئەڕوات بۆ نەهرەوان بۆلای خەواریجەکان، خەواریجەکان پردەکە ئەگرن و خۆی و هاوەڵانی ئەکوژن.

٦١ - إبن أبي عتبة الكندي ئەڵێت :

(ئەڕۆیشتین بۆلای نوف البكالي، کاتێک ئێمە لەلای بووین پیاوێک هات بۆلای و وتی : (ئەی باوکی يزيد خەوێکم پێتەوە بینیوە) .

وتی : (بیگێڕەرەوە) .

وتی : (بینیمیت پێشڕەوی سوپایەکت ئەکرد، ڕمێکت پێبوو سەری ڕمەکە ڕوناکیەکی پێوەبوو، وە بووبووە ڕۆشنایی بۆ خەڵکی) .

نوف وتی : (ئەگەر بەڕاستی خەوەکەت گێڕابێتەوە ئەوە شەهید ئەبم)

.

ئەوەندەی پێ نەچوو سوپا دەرچوو لەگەڵ محمد بن مروان بۆ الصائفة، کاتێک ئامادەی ڕۆشتن بوو ڕۆیشتم بۆ لای هەتا ماڵئاوایی لێ بکەم کاتێک پێی خستە ناو ئاوزەنگی ئەسپەکەیەوە وتی : (ئەی پەروەردگارم ژنەکەم بێوەژن بکە، منداڵەکەم هەتیو بخە، وە ڕێز لە نوف بگرە بە شەهید بوون) .

کاتێک گەیشتنە بقباقب دوژمن بەسەر ئەسپەوە بەرەوڕوویان هاتن، کاتێک - نوف - گەیشت بە دوژمن تووند بوو لەسەریان، یەک بە یەک ئەیکوشتن، یەکێک لەوانەی کە لەگەڵیدا بوون وتی : (کاتێک ئێمە گەیشتینە لای خوێنی تێکەڵ بووبوو بە خوێنی ئەسپی دوو کوژراو) .

**٦٢ - السدي** وتی :

عمرو بن عتبة بن فرقد دەرچوو بۆ جیهاد، ئەسپێکی کڕی بە چوار هەزار درهەم، - خەڵکی - پارەکەیان بە زۆر دانا، عمرو وتی : (هیچ هەنگاوێک نییە کە بینێت بەرەو دوژمن ئیللا لەو چوار هەزارە لەلام خۆشەویسترە) .

٦٣ - السدي وتی :

عمرو بن عتبة دەرچوو بۆ جیهاد، جلێکی سپی لەبەر کرد و وتی : (چ شتێک بەسەر ئەم جلە سپەیەمەوە جوانترینە؟)

مطرف وتی : (جلێکی لەم جۆرە و لەو جۆرە) .

عمرو وتی : (لە ناخی خۆمدا هیچ شتێکم لە خوێن پێ باشتر نییە لەسەری) .

٦٤ - عمرو بن عتبة بن فرقد ئەڵێت :

(داوای سێ شتم لە الله عز وجل کردووە دووانی پێداوم، وە چاوەڕێی سێیەمیان ئەکەم، داوام لێکرد وام لێ بکات لە دنیادا زاهید بم، جا گرنگی نادەم بەوەی چی دێتە ڕێم و چی بەسەرمدا تێئەپەڕێت، وە داوام لێ کرد بەهێزم بکات لە ئەنجامدانی نوێژەکانم، جا ئەوەشی پێ بەخشیم، وە داوای شەهیدبوونم لێ کردووە، داواکارم پێم ببەخشێت) .

٦٥ - عطاء بن قرة وتی :

(لەگەڵ أبي محذورة - هاوەڵی رسول الله ﷺ - بووین، ترێی بۆ هێنناین و داینا، داوای قەڵەم و وەرەقەی کرد و وەسیەتێکی نووسی، پاشان أبو كرب ئەوی بینی وەسیەتێکی نووسی، پاشان مقاتل النبطي هەستا و وەسیەتێکی

نووسی، پاشان عمار بن أبي أيوب یش هەستا و وەسیەتێکی نووسی، پاشان عوف اللخمي هەستا وەسیەتێکی نووسی، دوای ئەوەی لەگەڵ دوژمن ڕووبەڕووی یەک بووینەوە لە برحان ئەو پێنجە هیچیان نەمانەوە و کوژران، ئێمە وەسیەتمان نەنووسی و نەکوژراین) .

٦٦ - سهيل بن أبي صالح وتی :

(کاتێک رسول الله ﷺ ڕۆژی ئوحود دەرچوو بۆ جیهاد فەرمووی : (کێ ئەمشەو سەرپەرشتیاری پاراستنی ئەم سەنگەرە ئەکات؟) .

پیاوێک هەستایەوە لە ئەنساریەکان لە بني زريق، پێی ئەوترا أبو السبع ذكوان بن عبد قيس .

وتی : من .

فەرمووی : (تۆ کێیت؟) .

وتی : من أبو السبع م .

فەرمووی : (دانیشە) .

پاشان داوای کردەوە و ذكوان هەستا .

فەرمووی : (تۆ کێیت؟)

وتی : (من أبو السبع م) .

فەرمووی : (لەو شوێنە و لەو شوێنەدا جێگیر بن) .

ذكوان وتی : (ئەی رسول الله كەسی تری لێ نییە بەس خۆمم، وە دڵنیا نابین لەوەی موشریكەكان جاسوسێكیان دانەنابێت بەسەرمانەوە) .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (هەر كەسێک ئەیەوێت تەماشای پیاوێک بكات كە بەیانی پێیەكانی ئەخاتە سەوزایی بەهەشتەوە ئەوە تەماشای ئەمە بكات) .

ذكوان ڕۆیشت بۆلای خێزانەكەی تا ماڵئاواییان لێبكات، هاوسەرەكانی كراسەكەیان گرت و وتیان ئەی أبو السبع ئەڕۆیت و بەجێمان ئەهێڵیت؟ كراسەكەی ڕاوەشاند و ڕۆی، پاشان لای كردەوە و وتی : (مەوعیدتان ڕۆژی قیامەتە)، پاشان كوژرا .

٦٧ - العلاء بن هلال الباهلي ئەڵێت :

(پیاوێک لە خزمانی صلة بە صلة ی وت : (ئەی باوكی الصهباء، لە خەومدا بینیم من شەهیدبوونێكم پێ درا، وە تۆش دوو شەهیدبوونت پێ درا) .

صلة وتی : (ئەوەی بینیوتە چاکە، شەهید ئەکرێیت، وە من و کوڕەکەشم شەهید ئەکرێین) .

جا لە ڕۆژی یزید بن زیاد ـدا تورکەکان - ئەوکاتە کافر بوون - ڕووبەڕوویان بوونەوە لە سجستان، جا یەکەم سوپا لە موسوڵمانان کە تێکشکا ئەو سوپایە بوو .

صلة بە کوڕەکەی وت : (کوڕی خۆم بڕۆرەوە بۆلای دایکت) .

کوڕەکەی وتی : (باوکە گیان، تۆ خێر و چاکەت بۆ خۆت ئەوێت و فەرمان بە من ئەکەیت بگەڕێمەوە؟ سوێند بە الله تۆ لە من باشتری بۆ دایکم) .

صلة وتی : (مادەم وا ئەڵێیت پێشکەوە - واتە بڕۆ شەڕ بکە - ) .

٦٨ - **ثابت البناني** لە معاذة ى خێزانی صلة ـەوە ئەگێڕێتەوە : (کاتێک هەواڵی پێگەیشت کە کوڕ و مێردەکەی پێکەوە مردوون، ژنان هاتن بۆلای، - معاذة - وتی : (ئەگەر هاتوون بۆ پیرۆزبایی لێکردنمان لەبەر ئەو ڕێزەی الله پێی بەخشیوین ئەوە باشە، ئەگەر لەبەر ئەوەش نەهاتوون بگەڕێنەوە) .

ثابت البناني ئەڵێت : (ڕۆژێک صلة نانی ئەخوارد، کەسێک هات پێی وت : براکەت مرد .

وتی : هیهات ! پێش تۆ هەواڵی مردنیان پێدام، دانیشە .

پیاوەکە وتی : هیچ کەس پێش من هەواڵی مردنەکەی بە تۆ نەداوە .

صلة وتی : اللّٰه عز وجل ئەفەرمووێت : | إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ | (الزُّمَر : ٣٠) .

٦٩ - حميد بن هلال وتی :

(کاتێک أبو رفاعة لە نوێژکردن تەواو ببوایە دوعای ئەکرد، لە کۆتایی دوعاکەیدا ئەیوت : ئەی پەروەدگارم بمژیەنە هەتا ژیان باش بێت بۆم، وە ئەگەر بۆم باش نەبوو بممرێنە بە مردنێکی پاک و چاک کە برایانی موسوڵمانم بیستیان هیوای پێ بخوازن لە بەر پاکی و چاکی مردنەکە، وە با مردنەکە کوژرانێک بێت لەپێناو تۆ، وە لە نەفسی خۆم بمپارێزە . . . ) .

٧٠ - مجاهد بن جبر ئەڵێت :

أم مبشر وتی : ئەی رسول اللّٰه، چ کەسێک باشترین و چاکترین پێگەی هەیە لەلای اللّٰه عز وجل؟

فەرمووی : (پیاوێک لەسەر پشتی سواریەکەی بێت، دوژمن بترسێنێت و دوژمن بیترسێنن، پاشان بە دەستی ئاماژەی کرد بۆ حیجاز، فەرمووی : (وە پیاوێک کە نوێژ ئەکات و حەقی الله عز وجل ئەدات لە پارە و سامانی) .

٧١ - أبي سعيد الخدري رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

(رسول الله ﷺ لە جەنگی تەبوکدا وتارێکی بۆ داین، پاڵی دابوویەوە بە دارخورمایەکەوە، فەرمووی : ئایا هەواڵتان پێ نەدەم دەربارەی باشترینی خەڵکی و خراپترینی خەڵکی؟

باشترینی خەڵکی ئەوەیە کە جیهاد ئەکات لەپێناو الله دا لەسەر پشتی ئەسپەکەی، یان لەسەر پشتی هێسترەکەی، یاخود لەسەر پێیەکانی و هەتا مردن پێی ئەگات و ئەویش لەسەر ئەو بارودۆخەیە .

وە خراپترینی خەڵکی کەسێکی خراپەکاری چاونەترسە کە کتێبی الله عز وجل ئەخوێنێتەوە بەڵام ناگەڕێتەوە لە شتێک کە تێیدایەتی) .

٧٢ - إبن عباس رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

(دانیشتبووین لە مەجلیسێکدا و رسول الله ﷺ هات بەسەرماندا و فەرمووی : ئایا پێتان بڵێم کێ خاوەنی چاکترین پێگەیە؟

وتمان : بەڵێ ئەی رسول الله .

فەرمووی : پیاوێک کە لەپێناو الله لەسەر ئەسپەکەی شەڕ ئەکات هەتا ئەمرێت یان ئەکوژرێت .

ئەی پێتان بڵێم کێ لەدوای ئەو دێت؟

وتمان : بەڵێ ئەی رسول الله .

فەرمووی : پیاوێک خۆی دوورخستووەتەوە لە دۆڵێکدا، نوێژی ئەکات و ڕۆژوو ئەگرێت و خۆی لە خەڵکانی خراپ ئەپارێزێت .

ئەی پێتان بڵێم کێ خراپترین کەسە؟

وتمان : بەڵێ ئەی رسول الله .

فەرمووی : ئەوەی لەبەر الله داوای لێ ئەکرێت بەڵام نابەخشێت .

**٧٣ - الحسن البصري** لە تەفسیری ئایەتی : | **يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اصْبِرُوا وَصَابِرُوا وَرَابِطُوا** | (آل عمران : ٢٠٠) .

ئەڵێت : (فەرمانی پێ کردن ئارام بگرن لەسەر دینەکەیان، وە دەستی لێ بەرنەدەن لەبەر ناخۆشیەک یان خۆشیەک، وە لە بوون و نەبوونیدا،

وە فەرمانی پێ کردن کە ئارام لەسەر کافرەکان بگرن، وە لە سەنگەردا بوەستن بۆ موشریکەکان) .

٧٤ - **قتادة** ئەیوت :

(ئارام بگرن لەسەر موشریکەکان، وە لەپێناو الله دا سەنگەر بگرن)

.

٧٥ - **رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت :

(هەموو مردوویەک مۆر ئەدرێت لە ئەو کردەوەیەی کە لەسەری ئەمرێت، جگە لە کەسێک نەبێت کە لەپێناو الله لە سەنگەردایە - جیهاد ئەکات - ، کار و کردەوەکەی گەشە ئەکات هەتا ڕۆژی قیامەت، وە پارێزراو ئەبێت لە تاقیکردنەوەی قەبر) .

٧٦ - **رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت :

(تێکۆشەر ئەو کەسەیە کە تێکۆشان لەگەڵ نەفسی خۆیدا ئەکات).

---

: واتە ئەمر بە نەفسی ئەکات بە چاکە، وە ڕێگری لە نەفسی ئەکات لە خراپە .

٧٧ - **رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت :

(هەر کەسێک بڕواتە شوێنێک تێیدا لە موشریکەکان بترسێت یاخود موشریکەکان بیترسێنن هەتا ئەمرێت، ئەوە هەتا قیامەت پاداشتی سوجدەبەرێکی بۆ ئەنووسرێت کە سەری لە سوجدە بەرز ناکاتەوە، وە پاداشتی ئەو کەسەی کە نوێژ ئەکات و تەواو نابێت، وە پاداشتی ئەو ڕۆژووگرەی کە ڕۆژووەکەی ناشکێنێت) .

٧٨ - **رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت :

(هەموو مردوویەک مۆر لە کار و کردەوەکانی ئەدرێت بێجگە لەوە نەبێت کە لە پێناو الله دا ئەمرێت، پاداشتی کردەوەکانی بۆ دێت هەتا زیندوو ئەکرێتەوە) .

٧٩ - **عبدالله بن عمرو** رضي الله عنهما ئەفەرمووێت :

(هەر کەسێک لەکاتی سەنگەرگرتندا بمرێت ئەوە سەلامەت ئەبێت لە ناڕەحەتیە گەورەکە ی ڕۆژی قیامەت) .

٨٠ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(لە ڕۆژی قیامەتدا الله عز وجل کۆمەڵانێک زیندوو ئەکاتەوە بەسەر پردی صراط دا تێئەپەڕن وەکو با، نە لێپرسینەوەیان لەسەرە، وە نە سزا ئەدرێن) .

وتیان : ئەوانە کێن ئەی رسول الله؟

فەرمووی : (کۆمەڵانێک کە مردن پێیان ئەگات کاتێک لە سەنگەرگرتندان) .

٨١ - مكحول ئەڵێت :

(كعب بن عجرة سەنگەری گرتبوو لە زەوی فارس دا، سلمان رضي الله عنه بەلایدا تێپەڕی وتی : ' چی ئەکەیت لێرە؟ ' .

وتی : ' هاتووم سەنگەر بگرم ' .

سلمان وتی : ' ئایا شتێکت بۆ بگێڕمەوە لە رسول الله ﷺ گوێم لێبووە کە ببێت بە یارمەتیدەرت لەسەر سەنگەرگرتنەکەت؟ ' .

وتی : ' بەڵێ ڕەحمەتی الله ت لێبێت ' .

سەلمان وتی : رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (سەنگەرگرتنی رۆژێک لەپێناو الله عز وجل دا باشترە لە رۆژووی و شەونوێژی مانگێک، وە هەر کەسێک لە کاتی سەنگەرگرتندا لە پێناو الله دا وەفات بکات پارێزراوە لە تاقیکردنەوەی قەبر، وە پاداشتی ئەو کار و کردەوەیەی بۆ دێت کە ئەنجامی ئەدا هەتا رۆژی قیامەت) .

٨٢ - **رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت :

(وا خەریکە سەردەمێک بێت بەسەر خەڵکیدا باشترینیان پیاوێکە دەستی گرتووە بە لغاوی ئەسپەکەیەوە، هەرکاتێک گوێی لە هاواری جەنگ بێت ئەڕواتە سەر ئەسپەکەی و بۆ مەرگ بەرەوپێش ئەڕوات، وە پیاوێک لەناو مەڕ و ماڵاتەکەیدا لە دۆڵێک لەم دۆڵانە نوێژ ئەکات و زەکات ئەدات و خۆی لە خەڵکی بەدوور ئەگرێت تەنها لە خێردا نەبێت، هەتا مردن پێی ئەگات) .

٨٣ - **عبدالله بن عمرو** رضي الله عنهما ئەفەرمووێت :

(ئەگەر شەو بکەمەوە بە سەنگەرگرتن و ترسەوە لە پێناو الله عز وجل دا ئەوە پێم خۆشترە لەوەی سەد سواری ببەخشم) .

٨٤ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(سێ چاو هەرگیز ئاگر نایانسوتێنێت، چاوێک گریابێت لە ترسی الله، وە چاوێک شەونخونی کردبێت لەبەر خوێندنەوەی قورئان، وە چاوێک ئێشکگری کردبێت لەپێناو الله عز وجل) .

٨٥ - عثمان بن عفان رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

(نەفەقە لە زەوی هیجرەتدا بە حەوسەد ئەوەندەیە، وە ئێوەش هیجرەت ئەکەن بۆ شام، ئەگەر پیاوێک لە بازاڕ شتێک بە یەک درهەم بکڕێت، خۆی بیخوات و بیدات ئەهلەکەی وەکو ئەوە وایە حەوسەد درهەمی پێ دابێت) .

٨٦ - مجاهد بن جبر ئەڵێت :

(لە سەفەردا هاوەڵێتی إبن عمر م ئەکرد بۆ ئەوەی خزمەتی بکەم، بەڵام ئەو خزمەتی منی ئەکرد) .

٨٧ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

(باشترین هاوەڵ لەلای الله عز وجل باشترینیانە بۆ هاوەڵەکەی، وە باشترین دراوسێ لەلای الله عز وجل باشترینیانە بۆ دراوسێیەکەی) .

٨٨ - عبدالله بن عمرو رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

(ئەو کارە چاکەی ئەمڕۆ ئەیکەم دوو هێندەی ئەو کارە چاکە پێم خۆشە کە لەپێشتر ئەمکرد، چونکە لەگەڵ رسول الله ﷺ دا بووین و هەوڵ و کۆششمان بۆ قیامەت بوو، دنیا بەلامانەوە گرنگ نەبوو، بەڵام ئێستا دنیا هاتووە بەپیریمانەوە) .

٨٩ - عبدالله بن عمرو رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

(بەهەشت بۆ ئەو نامۆیانەی کە کاری چاکە ئەکەن لە کاتی خراپبوونی خەڵکیدا) .

٩٠ - أبو بكر الصديق رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

(دوعا کردن بۆ برا لەپێناو الله وەڵامدراوەیە) .

٩١ - خالد بن الوليد رضي الله عنه فەرمووی :

(ئەگەر ڕۆژی موئتە بتانبینیایە چۆن حەوت شمشێر بە دەستمەوە شکا، پاش ئەوە دەستم دایە صحيفة يمانية) .

---

: (صحيفة يمانية) جۆرە شمشرێکی گەورە و بەهێزە .

**٩٢ - أبي نجيح السلمي** ئەڵێت :

(لەگەڵ رسول الله ﷺ دا گەمارۆی قەڵای الطائف م دا، گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو فەرمووی : ' هەر كەسێک تیرێک بهاوێژێت بگات بە مەبەستەكەی، ئەوە پلەیەک لە بەهەشتی بۆ هەیە .

پیاوێک وتی : ' ئەی پێغەمبەری الله، ئەگەر تیرێكم هاویشت و دام لە ئامانجەكەم ئەوە پلەیەكی بەهەشتم بۆ هەیە؟ ' .

فەرمووی : ' بەڵێ ' .

جا ئەو رۆژە شازدە تیرم ئامانجی پێكا) .

**٩٣ - رسول الله ﷺ** ئەفەرمووێت :

(هەر كەسێک لەپێناو الله دا مووی سپی ببێت ئەوە لە قیامەت ئەبێت بە نوور بۆی) .

---

: واتە هەر كەسێک جیهاد بكات و لەو ڕێگایەدا مووی قژ یان ڕیشی سپی ببێت ئەوە ئەبێت بە ڕووناكی بۆی لە قیامەتدا .

**٩٤** - ئیمام **عمر بن الخطاب** رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

(ئەگەر سێ شت نەبوویایە : ئەگەر لەپێناو الله عز وجل رێم نەكردایە - واتە بۆ جیهاد - ، یان ناوچاوانم لە سوجدەدا خۆڵاوی نەبووایە، یاخود دانەنیشتمایە لەلای كۆمەڵەیەک كە وتەی باش هەڵئەبژێرن وەک چۆن بەروبووم و بەرهەمی باش هەڵئەبژێردرێت، ئەوە حەزم ئەكرد بگەیشتمایەتەوە بە الله عز وجل) .

**٩٥** - **رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت :

(دەرچوونێک لە بەیانیدا لەپێناو الله عز وجل، یاخود رێكردنێک - بۆ جیهاد - باشترە لەوەی كە خۆر بەسەریدا هەڵهاتووە و ئاوا بووە) .

**٩٦** - **عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما ئەفەرمووێت :

(دەرچوونێک لەپێناو الله عز وجل - واتە بۆ جیهاد - باشترە لە پەنجا حەج) .

**٩٧ - أبي بكر بن عبدالله بن قيس** وتی :

( گوێم لە باوکم بوو لەکاتێکدا دوژمن ئامادە بوو فەرمووی : ' رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت ' دەرگاکانی بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێرەکاندان ... ' ) .

**٩٨ - أبو عمران الجوني** وتی :

(کاتێک أبو موسى الأشعري لە ڕیز دا بوو دژی دوژمنان لە ئەصبەهان وتی گوێم لە رسول الله ﷺ بوو فەرمووی : (دەرگاکانی بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێرەکاندان)، گەنجێک هەستایەوە و وتی : ' ئەوە چیت وت ئەی أبا موسى؟ ' ، فەرموودەکەی بۆ دووبارە کردەوە، گەنجەکە لای کردەوە بۆلای هاوەڵەکانی و سەلامی لێکردن، پاشان چوویە ژێر سێبەری شمشێرەکانەوە) .

**٩٩ - عبدالله بن عباس** رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

(ئەم ئایەتە | **إِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ** | دابەزی لەسەر موسوڵمانان قورس بوو کە لەسەریان فەرز بوو یەک دانەیان لە دە کەس هەڵنەیەت - لە کاتی جەنگدا - ، پاش ئەوە ئاسانکاریان بۆ هات : | **الْآنَ خَفَّفَ اللَّهُ عَنْكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا فَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ مِائَةٌ صَابِرَةٌ**

**يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ** | جا كاتێک الله ژمارەکەی لەسەر کەم کردنەوە هێندەی کەمکردنەوەکە صەبریان کەمی کرد .

**١٠٠ - عبدالله بن عمر** رضي الله عنه دەربارەی نوێژی ترس ئەفەرمووێت : (ئیمام نوێژ ئەکات و کۆمەڵەیەک لە جەنگاوەران لەگەڵیدان، وە کۆمەڵەکەی دیکەش بەرامبەر دوژمنن، ئیمامەکە و جەنگاوەرەکان ڕکعاتێک نوێژ ئەکەن پاش تەواوبوونیان ئەڕۆنە شوێنی ئەو هاوەڵانەیان کە بەرامبەر دوژمن وەستاون، ئەو کۆمەڵەیەی کە نوێژیان نەکردووە، لەگەڵ ئیمامدا ڕکعاتێک نوێژ ئەکەن، پاشان ئیمامەکە سەلام ئەداتەوە، وە هەردوو کۆمەڵەکە بۆخۆیان یەک ڕکعات نوێژ ئەکەن) .

---

: واتە کۆمەڵەیەک دەست ئەکات بە نوێژ لەگەڵ ئیمام، یەک ڕکعات نوێژ ئەکەن لەگەڵ ئیمام، پاشان خۆیان ڕکعاتی دووەم ئەکەن بەبێ ئیمام، پاش ئەوە ئەچنە شوێنی جەنگاوەرەکانی تر، جەنگاوەرەکانی تر کە نوێژیان نەکردووە یەک رکعات نوێژ ئەکەن لەگەڵ ئیمام، پاشان ئیمام سەلام ئەداتەوە، ئینجا ئەوان بۆ خۆیان ڕکعاتی دووەم ئەکەن، واتە هەر کۆمەڵەیەک ڕکعاتی یەکەمیان لەگەڵ ئیمام ئەکەن، وە ڕکعاتی دووەمیان بۆخۆیان بەبێ ئیمام ئەیکەن، والله أعلم .

١٠١ - حماد ئەڵێت :

(پرسیارم کرد لە إبراهیم دەربارەی پیاوێک کە بەدوای کەسێکی ترەوەیە، یاخود بەدوایەوەن، وە ئەگاتە کاتی نوێژ؟

وتی : ' نوێژ ئەکات ڕووی لە هەر شوێنێک بێت، سەری بەرەو پێشەوە نزم ئەکاتەوە، لە سوجدەدا زیاتر سەری نزم ئەکاتەوە بە بەراورد بە ڕکوع، وە واز لە دەستنوێژ و خوێندنەوەی ویردەکانی ناو نوێژ ناهێنێت ' ) .

١٠٢ - الزهري دەربارەی وتەی الله عز وجل | فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا | (البقرة : ٢٣٩)

ئەڵێت : (ئەگەر دوژمنان بەدوایانەوە بوون، ئەوە بۆیان حەڵاڵە بەرەو هەر ڕوویەک کە لەسەرین نوێژ بکەن، ئەگەر بە پێ بڕۆن، یان بە سواری، دوو ڕکعات ئەکات و خۆی تێدا ئەچەمێنێتەوە) .

قتادة ئەڵێت : (یەک ڕکعات یش هەر جائیزە) .

١٠٣ - سابق البربري ئەڵێت :

(مكحول نامەی بۆ حسن البصري نووسی، نامەكەی گەیشت كاتێک ئێمە لە دابق بووین، دەربارەی پیاوێک كە بەدوای دوژمنە بەزیووكەیەوەیەتی و كاتی نوێژی بەسەردا دێت، ئایا لەسەر پشتی ئەسپەكەی نوێژ بكات؟

حسن وتی : ' دائەبەزێت، وە ڕوو ئەكاتە قیبلە، وە ئەگەر دوژمنەكانیان بەدوایانەوە بوون ئەوە لەسەر پشتی ئەسپەكەی نوێژ ئەكات بە خۆچەماندنەوە ' ) .

١٠٤ - عطاء ئەڵێت :

(ئەگەر تۆ بەدوایانەوە بوویت - واتە دوژمن - ئەوە دابەزە و نوێژ بكە، ئەگەر بەدواتەوە بوون ئەوە بە چەماندنەوەی سەر نوێژ بكە) .

والحمد لله رب العالمين

